

# ئەو هۆکارانەی کە ئەنجامدانی شەونوێژ ئاسان دەکەنەوە








وەرگێڕانی
مامۆستا دارا جبار

چاپی دووەم

١٣٤٥کۆچی

# ئەو هۆکارانەی کە

# ئەنجامدانی شەونوێژ

# ئاسان دەکەنەوە


نوسینی

وحید عبدالسلام بالی

وەرگێرانی

مامۆستا دارا جبار کریم

پێداچوونەوەی

مامۆستا عدنان بارام کەلاری



چاپی دووەم

١٤٣٥ کۆچی

ناوی کتێب : ئەو هۆکارانەی کە ئەنجامدانی شەونوێژ ئاسان دەکەنەوە
ناوی نووسەر : وحيد عبدالسلام بالي .
ناوی وەرگێڕ : مامۆستا دارا جبار.
پێداچوونەوەی : مامۆستا عدنان بارام
نۆرەی چاپ : دووەم
ساڵی چاپ : ( ١٤٣٥ کۆچی ).
شوێنی چاپ : چاپخانەی زانا – سلێمانی ، شەقامی مەولەوی
==============================
بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوە
«سەنتەری کارزان» چەمچەماڵ ، پشت بازاڕی دۆلارەکە
٠٧٧٠٧٧٢٦١١٤
بنکەکانی بڵاوکردنەوە :

| | |
|---|---|
| کتێبخانەی پێشین – هەولێر | کتێبخانەی کاروانی زانست – کفری |
| تۆمارگای شافعی – هەولێر | کتێبخانەی سوننە – سلێمانی |
| کتێبخانەی صهيب – کۆیە | کتێبخانەی الأثر – سلێمانی |
| کتێبخانەی دێرین – سۆران | کتێبخانەی زانستی بەسوود - کەلار |
| کتێبخانەی سیما –چەمچەماڵ | کتێبخانە و تۆمارگای بەهەشت - کەلار |

سەرپەرشتی چاپ : کتێبخانە و تۆمارگای بەهەشت
کەلار – شەقامی سەرەکی – نزیك فلكەی ناوبازاڕ – تەنیشت چێشتخانەی شێروانە

إِنَّ الحَمْـدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُـوْذُ بِاللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْـدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَـهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَـهُ ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ وَحْـدَهُ لا شَرِيْكَ لَـهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ أَمَّا بَعْدُ

بەڕاستی شەو نوێژ یەكێكە لە پەرستشە مەزنەكان ، و نزیك بوونەوە گەورەكان ، كەپیاو چاكە پێشینەكان خوایان لیّ ڕازی بێت بەردەوام بوون لەسەری ، بە جۆرێك كە ئەگەر بڕۆیشتایەیتە شارێك لە شارەكان لەسەردەمی ئەوانەدا گویّ بیستی دەنگیان دەبوویت لەشەودا وەكو دەنگی شارە هەنگ ، هەریەكێكیان لەماڵەكەی خۆیدا شەونوێژی دەكرد و هانی خێزان و منداڵەكانی دەدا لەسەر ئەم پەرستشە

بەڕاستی شەو نوێژ چێژوشیرینییەكی تایبەتی هەیە هیچ كەس هەستی پیّ ناكات كەسێك نەبێت كە لە تاریكایی شەودا پیّ یەكانی ڕێك كردبێت لەبەر خوا خەریكی خوا پەرستن بێت ، و سكاڵای تاوانەكانی بكات ، وە مناجاتی خودا بكات ، وە داوای بەهەشتەكەی بكات ، بە ئومێدی ڕەحمەتەكەی بێت ، و لە سزاكەی بترسێت ، و پەنابگرێت لە ئاگرەكەی

وە بەڕاستی ئەم چەند ووشەیەم بۆ هەندیّ برای موسڵمانم نووسی بوو بەتایبەت هەندێك لاوی بۆ خوا سوڵحاو ، ئەوانەی كە

كاردەكەن لە پێناوی سەرخستنی ئەم ئایینە و لەو پیناوەدا هەموو شتێكی بەنرخ و گران بەها دەبەخشن ، چونكە شەونوێژ جیهادی شاراوەیە ، وە كارێكە كە جێگای ڕەزامەندی خودایە ، وە هەوڵێكە كە خودا پاداشتی لەسەر دەداتەوە ، وە ئەوەی هانی دام بۆ نوسینی ئەم نامیلكەیە زۆری سكاڵای ئەو لاوانە بوو لە كەم تورخەمی كردنیان بوو بۆ شەو نوێژ ، لەگەڵ هەبوونی ویستێك بۆ هەستان بۆ شەونوێژ بەڵام كەم تەرخەمی دەیانگرێت لەم بوارەدا بۆیە جارێك هەڵدەستن بۆ شەونوێژ و چەند جارێك دەخەون و لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان حەسرەتێك و پەشیمانێك دەنوێنن ، لەسەر ئەوەی كەلەدەستیان دەچێت لەو كردەوە گەورەیە ، وە پاداشتە گەورەیە ، تەنها لەبەر ئەو جۆرە لاوانە ئەم نامیلكەیەم نووسیوە لەخوای بەرز و باڵا دەست دەپاڕێمەوە كە سودبەخش بێت بۆ هەر كەسێك كە دەیخوێنێتەوە و چاوێ بەسەردا دەگێڕێت ، ئەو چێژەمان پێ ببەخشێت و ئەو شیرینیەشمان پێ كەرەم بكات ، بە ڕاستی خوای گەورە بیسەرە و وەڵامی داواكان دەداتەوە وصل اللهم و بارك علی محمد وعلی اله وصحبه و التابعین

هەژارترین بەندە بۆلای خوا

وحید عبدالسلام بالی

## (( فەزڵ و چاكەی شەو نوێژ ))

بەڕاستی خوای گەورە وەسفی لەخواترسان دەكات و دەفەرمووێت ﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ * آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُحْسِنِينَ ﴾ ، واتە : لەدونیادا چاكەكاربوون ئینجا چاكەكاری لە كارەكانیاندا ڕوون دەكاتەوە و دەفەرمووێت ﴿ كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ * وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾[1]

( الحسن البصري ) – ڕەحمەتی خوای لیّ بێت– دەفەرمووێت : بەرگەی ناڕەحەتیەكانی شەونوێژیان گرتووە ، بەشەو ناخەون كەمێك نەبێت ، وە چالاك بوون تا گەشتە ئەوەی شەونوێژەكەیان درێژ كردەوە بۆ پارشێو ، وداوای لیّ خۆشبونیان لە پارشێودا كردووە

هەروەها خوای گەورە وەسفی ئیمانداران دەكات و دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّدًا وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ * تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ ﴾[2] مەبەست لەمە شەونوێژ و وازهێنانە لە خەوتن و پاڵ كەوتن لەسەر جێگای نەرم و خۆش

---

[1] – سورة الذاريات من الآية ( ١٥ – ١٨ )

[2] –تفسير القرآن العظيم ( ٤ / ٢٥٠ )

ئینجا خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ واتە: لەترسی توندی سزا و بە ئومێدی زۆری پاداشتی[٣]

ئەدی چۆن شەو نوێژ ناکەن ، لەکاتێکدا پێشەواو سەروەریان پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە شەونوێژی دەکرد هەتاوەکو پێیەکانی دەئاوسان ، هەر وەکو( عبدالله ی بن رواحه ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – وەسفی دەکات و دەڵێت:

وفينا رسول الله يتلو كتابه

إذا انشق معروف من الصبح ساطع

أرانا الهدى بعد العمى فقلوبنا

به موقنات أن ما قال واقع

يبيت يجافي جنبه عن فراشه

إذا استقلت بالمشركين المضاجع

واتە پێغەمبەری خوامان ﷺ تێدایە کتێبەکەی دەخوێنێتەوە تاکو بەرە بەیان ، هیدایەتی پێنیشان داین لەدوای کوێری و گومڕای ، بۆیە دڵەکانمان یەقینی هەیە کە ئەوەی دەیڵێت ڕوودەدات ،

[٣] – راجع تفسير القران العظيم ( ٣ / ٤٦٨ ) .

شەوان ئەو لە شوێن نوستنەکەی دوور دەکەوێتەوە لە کاتێکدا بێ باوەڕان لە شیرینی خەودان

پاشان خوای گەورە باسی پاداشتی دەکات و دەفەرمووێت : ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾[٤] ، واتە هیچ کەسێك گەورەیی ئەو شتە نازانێت کە خوای گەورە شاردویەتەوە لە بەهەشتەکاندا لە خۆشی نەبڕاوەی بەردەوام کە هیچ کەس هاوشێوەی ئەو خۆشیانەی نەبینیوە ، لەبەر ئەوەی کردەوەکانیان شاردۆتەوە بۆیە خوای گەورەش ئەو پاداشتە گەورەیەی بۆیان شاردۆتەوە ، پاداشتێك بە پێی کردەوەکانیان چونکە پاداشت لە جۆری ( ڕەگەزی )کارە( الجزء من جنس العمل ).

پێشەوا ( الحسن البصری ) ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ دەفەرمووێت : کەسانێك کردەوەکانیان شاردەوە لە خەڵکی و خوداش پاداشتێکی شاردۆتەوە بۆیان کە نەچاو بینیویەتی و نەبەخوتورەی دڵی هیچ کەسێکدا هاتووە[٥]

هەروەها خوای گەورە لە سیفەتی بەندەکانی خۆیدا ( عباد الرحمن ) دا دەفەرمووێت : ﴿ وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا ﴾[٦] ،

---

[٤] - سورة السجدة الآية ( ١٥ — ١٧ ) .

[٥] - راجع تفسير القرآن العظيم ( ٣ / ٤٦٩ ) .

[٦] - سورة الفرقان الآية ( ٦٤ ) .

واتە : شەوەکانیان بە خودا پەرستن زیندوو دەکەنەوە ، بۆیە ئەوان بێدارن و نەخەوتوون لە کاتێکدا خەڵکانی تر نووستوون و بەئاگان لەکاتێکدا خەڵکانی تر بێ ئاگان و غافڵن ، لەبەر ئەوەی ئەوان بەتەنها خوایان خۆش ویستووە بۆیە چێژیان لە موناجاتی پەروەردگار وەرگرتووە

بەراستی سەبارەت بەوان جوانی فەرمووە

امنع جفونك أن تذوق مناما　　وأذر الدموع على الخدود سجاما

واعلم بأنك ميت ومحاسب　　يامن على سخط الجليل أقاما

لله قوم أخلصوا في حبه　　فرضى بهم واختصهم خداما

قوم إذا جنّ الظلام عليهم　　باتوا هنالك سجدا وقياما

خمص البطون من التعفف ضمرا　　لايعرفون سوى الحلال طعاما

واتە : لە چاوەکانت خەو قەدەغە بکە ، فرمێسك بڕێژە و با بەسەر گۆناکاندا بێتە خوارێ ، و بزانە بە ڕاستی تۆ دەمریت و لێ پرسینەوەت لەگەڵ دەکرێت ، ئەی ئەو کەسەی لەسەر تووڕەیی خودا بەردەوامیت ، خودا خەڵکانێکی هەیە کە بەڕاستی ڕاستگۆبوون لە خۆشەویستنیان بۆی ، و خواش لەوان ڕازی بووەو کردونی بە خزمەتکاری خۆی ، کەسانێکن کەتاریکی شەویان بەسەردا دێت

بەسوجدە و وەستان بەسەر دەبەن ، وە رگیان ئییەو لاوازن چونكە جگە لە حەڵاڵ هیچ خواردنێكی تر ناناسن

وە لە (عبدالله بن سلام )ـەوە– خوای لێ ڕازی بێت – كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی " أَيُّهَا النَّاسُ أَفْشُوا السَّلَامَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَصَلُّوا بالليلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلَامٍ "[٧] ، واتە : ئەی خەڵكینە سلام لەیەكتر بكەن ، وە خواردنی بەهەژاران بدەن ، وە لەكاتێكدا كەخەڵك نوستون ئێوە نوێژ بكەن ، لەپاداشتدا بەئاسوودەیە دەڕۆنە بەهەشتەوە

لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر ﷺ ڕوونی دەكاتەوە كە شەونوێژ هۆكارێكە لە هۆكارەكانی چوونە بەهەشتەوە بۆیە برای موسڵمانم – خوا سەركەوتووت بكات– دەستی پێوە بگرە ، چونكە شەونوێژ كلیلی خۆش بەختییە بەڵكو نوێژی شەو لە نوێژە سوننەتەكانی ڕۆژ چاكترە ، لەبەر ئەوەی نوێژی شەو نزیكترە لە كزۆڵی ( خشوع ) ونیەت پاكیەوە ( الاخلاص )

هەربۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت : " أفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمضَانَ شِهْرُ اللَّهِ الُمحَرَّمُ ، وأفْضَلُ الصَّلآةِ بَعْدَ الفَرِيضَةِ صَلآةُ اللَّيْلِ"[٨]

---

[٧] – رواه الترمذي ( ٤ / ٦٥ ) وقال حديث صحيح . صححه الألباني في الصحيحة ( ٨ / ١٧٦ ) ، والإرواء ( ٣ / ٢٩٣ ) ، وصحيح الترغيب ( ٦١٢ ) ، وتخريج فقه السيرة ( ٢١٣ ) .

[٨] – روه مسلم ( ٨ / ٥٤ نووي ) عن أبي هريرة .

واتە: چاكترین ڕۆژوو لە دوای ڕەمەزان مانگی خوایە كە موحەڕەمە ، وچاكترین نوێژێكیش لەدوای نوێژە فەرزەكان شەو نوێژە

وە شەو وەرزی دابەزینی ڕەحمەت و بەخشینەكانی خودای زەوی و ئاسمانەكانە ، وە كاتێكی چاك و پیرۆزە بۆیە بەغەنیمەتی بزانە و لە دەستی مەدە ، لە ( جابر) ەوە – خوای لێ ڕازی بێت – دەڵێت : گوێ بیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم دەیفەرموو " إِنَّ فِي اللَّيْلِ لَسَاعَةً لاَ يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ وَذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ"[٩] ، واتە بەڕاستی لە شەودا كاتێك (ساتێك ) هەیە هیچ پیاوێكی موسڵمان نایگاتێ و تیایدا داوای هەر چاكەیەكی دونیا و قیامەت بكات ئیلا خوای گەورە پێی دەبەخشێت ، ئەمەش لە هەموو شەوێكدا

وە ئەگەر موسڵمان بیر لە پاداشتی شەو نوێژ بكاتەوە هەرگیز وازی لێ ناهێنێت ، لە ( عبدالله بن عمرو بن العاص )ـەوە – خوایان لێ ڕازی بێت – لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی : " إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَغُرَفًا يُرَى بُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا وَظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا ، فَقَالَ أَبو مَالك الأشْعَري يَا رَسُولَ اللَّهِ لِمَنْ هِيَ قَالَ لِمَنْ أَطَابَ الْكَلَامَ ، وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ ، وَبَاتَ

[٩] - رواه مسلم ( ٦ / ٣٥ نووي )

قَائِمــا وَالنــاس نِيــام "[١٠] ، واتــە : لـە بەهەشـتدا ژووری وای تێدایـە لـە ناوەوەی دەرەوەی دەبینرێت و لە دەرەوەی ناوەوە دەبینرێت ، ( ابو مالـك ) فـەرمووی : بۆ كێیـە ئـەی پێغەمبـەری خـوا ؟ فـەرمووی بۆ ئەو كەسەیە كە گوفتـار شیرینە ، و خـواردن ئەبەخشێت ، وە شـەو نوێژ دەكات كاتێك كە خەڵكانی تر خەوتوون

وە بزانە – خوا بتپارێزێت – كە شەو نوێژ ڕێگەی پیاو چاكان و چاكە كارانە ، و هەڵوەرێنـە بۆ تـاوانی تاوانبـاران ، و هیدایـەت و ڕێنمووییــە بــۆ خراپــە كــار و سەرپێــچكاران ،لــە ( أبــی أمامــە البــاهلي)ــەوە– خــوای لــێ ڕازی بێــت– دەڵێــت گــوێ بیــستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم فەرمووی " عَلَيْكُمْ بِقِيَامِ اللَّيْـلِ ، فَإِنَّـهُ دَأْبُ الصَّالِحِينَ قَبْلَكُمْ ، وَهُوَ قُرْبَةٌ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ ، وَمَكْفَرَةٌ لِلسَّيِّئَاتِ ، وَمَنْهَاةٌ عَنِ الإِثْــمِ "[١١] ، واتــە: دەســت بگــرن بەشــەو نوێــژەوە چــونكە شــەو نوێــژ

---

[١٠] - رواه الطبراني في الكبير باسناد حسن قاله المنذري في الترغيب ( ٢ / ٢٤ ) وحسنه الهثمي في المجمع (٢ / ٣٥٤ ) ، صححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب ( ١ / ١٥٠ ) ، و ( ١ / ٢٣٠ )

[١١] - قال الهثيمي في الجمع ( ٢ / ٢٥١ ) رواه الطبراني في الكبير والأوسط وفيه عبدالله بن صالح كاتب الليث

قال عبدالملك بن شعيب ثقة مأمون وضعفه جماعة من الأئمة أ.هـ .

قلت منهم النسائي والإمام أحمد وابن خزيمة ، ولكن وثقه آخرون مثل يحيى بن معين وابن عدي وأبو حاتم ، وقال المنذري في الترغيب ( ٦ / ٣٤٨ ) قد روى عنه البخاري في صحيحه .

فمثل هذا حديثه لاينزل عن مرتبه الحسن إن شاء الله تعالى ولذلك حسنه العراقي في تخـريج الأحيـاء (٤ / ٦٣٤ ) والحديث له طريق أخرى عند الطبراني في الكبير عن سلمان الفارسـي رضـى الله عنــه ، وفيــه

ڕەوشتی پیاو چاكانی پێش ئێوەیە ، و نزیك كەرەوەیە لە پەروەردگارتان ، و مایەي سڕینەوەی تاوانەكانە ، و دوورخەرەوەیە لە تاوان

وەبزانە خوا ڕێنموویی بكات كە ڕێز و شكۆمەندی لە شەو نوێژدایە ، لە ( سهل كوڕی سعد ) - خوایان لیٚ ڕازی بێت - فەرمووی : جبریل هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : " یامحمد عش ما شئت فإنك میت ، واعمل ماشئت فإنك مجزی بە ، وأحبب ماشئت فإنك مفارقة واعلم أن شرف المؤمن قیامه باللیل ، وعزة استغناؤه عن الناس "[١٢] ، واتە ئەی محمد هەرچەندە دەژیت بژی هەر دەبێت بمریت وە هەرچ كارێك دەكەیت پاداشتەكەی وەردەگریتەوە ، هەر كەست خۆش دەوێت خۆشت بویٚ هەردەبێت لێی جیابیتەوە ، وە

---

عبدالرحمن بن سلیمان قال الحافظ في التقریب ( ١ / ٤٨٢ ) صدوق یخطيء أ.هـ ومثل هذا حدیثه حسن في الشواهد

وللحدیث طریق ثالثة عن بلال رضی الله عنه ، ولایصح لأن في إسناده محمد بن سعید الشامي المصلوب وهو كذاب وضاع ، ولذلك روى الترمذي ( ٥ / ٣١٢ ) حدیث أبي أمامه هذا وقال : هذا أصح من حدیث أبي إدریس عن بلال

قال الألباني ( حسن لغیره ) في صحیح الترغیب والترهیب ( ١ / ١٥١ ) والإرواء ( ٤٥٢ ) والمشكاة ( ١٢٢٧ )

[١٢] - قال الحافظ المنذري في الترغیب ( ٢ / ٢٣ ) : رواه الطبراني في الأوسط واسناده حسن ، حسنه الألباني الصحیحة ( برقم ٨٣١ ) ٢ / ٤٨٣

بزانــە شــەرەفی ئیمانــدار شــەونوێژەكەیەتی ، وە دەوڵەمەنــدی و دارندەیی بەندە لەوەدایە كەپێویستی بەخەڵكی نەبێت

وە ئەو موسوڵمانەی كە دەوەستێت لەشەودا شەونوێژ دەكات نزیكە لە خوای گەورەوە ، لە ( عمر بن عنبسة ) - خوای لیْ ڕازی بێت - دەفەرمووێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: " أقرب مايكون الرب من العبد في جوف الليل الآخر فإن استطت أن تكـون ممن يذكر الله في تلك الساعة فكن "[١٣] ، واتە : نزیكترین كات و شوێنێك كە خوا لەبەندە نزیك بێتەوە لەناو كۆتای شەودایە ، بۆیە ئەگەر توانیت لەوكەسانەبیت كە یادی خوا دەكەن لەو كاتەدا ( ساتەدا ) ئەوا لەوانبە

خوا بەرەكەتی برژێنێت بەسەردا ئەگەر یەكێك بیت لەوانەی كە شەونوێژ دەكەن ئەوا بەسە بۆ ئەوەی كەوا خوا خۆشی دەوێیت ، و جێی گومانی باش و وەسفی باش بێت لەلای

لە ( أبي الدرداء)ـەوە - خوای لێی ڕازی بێت - لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فەرمووی " ثَلاثَةٌ يُحِبُّهُمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ ، وَيَضْحَكُ إِلَيْهِمْ ، وَيَسْتَبْشِرُ بِهِمْ " الَّذِي إِذَا انْكَشَفَتْ فِئَةٌ ، قَاتَلَ وَرَاءَهَا بِنَفْسِهِ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ،

---

[١٣] - رواه الترمذي وقال حسن صحيح غريب ، صححه الألباني في صحيح وضعيف الترمذي بـرقم ( ٣٥٧٩ ) ٨ / ٧٩ ومشكاة ١٢٢٩ والتعليق الرغيب ٢ / ٢٧٦

فَإِمَّا أَنْ يُقْتَلَ ، وَإِمَّا أَنْ يَنصُرَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَيَكْفِيهِ ، فَيَقُولُ انْظُرُوا إِلَى عَبْدِي هَذَا كَيْفَ صَبَّرَ لِي نَفْسَهُ !! وَالَّذِي لَهُ امْرَأَةٌ حَسْنَاءُ وَفِرَاشٌ لَيِّنٌ حَسَنٌ ، فَيَقُومُ مِنَ اللَّيْلِ يَذَرُ شَهْوَتَهُ ، وَيَذْكُرُنِي وَلَوْ شَاءَ رَقَدَ !! وَالَّذِي إِذَا كَانَ فِي سَفَرٍ وَكَانَ مَعَهُ رَكْبٌ ، فَسَهَرُوا ثُمَّ هَجَعُوا ، فَقَامَ فِي السَّحَرِ فِي ضَرَّاءٍ وَسَرَّاءٍ ›› [١٤]

واتە سێ كەس هەن كە خوای گەورە خۆشی دەوێن ، و بۆیان پێدەكەنێت و جێی گومانی باش و وەسفی باش بێت لەلای

یەكەم ئەگەر خۆی و كۆمەڵەكەی لەجەنگدا شكان ، خۆی بەتەنها دەگەڕێتەوە و دەجەنگێت تاوەكو شەهید دەبێت یان خوای گەورە سەری دەخات ، خواش دەفەرموێت سەیری ئەم بەندەیەم بكەن چۆن لەبەر ڕەزامەندی من ئارامی گرت

دووەم ئەو كەسەی كە ئافرەتێكی جوان و نوێنێكی نەرم و چاكی هەیە ، هەڵدەستێت لە شەودا نوێژ دەكات ، خواش دەفەرموێت : واز لە شەهوەتی خۆی دێنێت و زیكر و یادی من دەكات ، و ئەگەر ویستی لێبێت دەنوێت

[١٤] – قال الحافظ المنذري في الترغيب ( ٢ / ٣٣ ) رواه الطبراني في الكبير باسناد حسن ، صححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب برقم ٦٢٩ ( ١ / ١٥٢ )

سـێیەم : وە ئـەو كەسـەی كـە ئەگـەر لـە سـەفەرێكدا بـوو ، وە كۆمەڵێك خەڵكی لەگەڵدا بوو ئەوان شەو نخوونی كرد ئینجا خـەوتن ، وە ئەویش هەستا لەكاتی پارشێودا شەونوێژی كرد بەخۆشی یان ناخۆشی ، ئای چ مژدەیەكی گەورە ؟! ، وە پلـەو پایەیـەكی بـەرزە ، كە بتوانرێت خۆشەویستی خودای گەورە بەدەست بێنیت ، دەتۆش خۆت بخەرە ڕیزی كردەوەكاران و خۆت بشوبهێنە بە پیاو چاكان و بە ڕێبـازی لـە خـوا ترسـاندا بڕۆ ، وە جیهـادی نەفسی خـۆت بكـە لەبـەر ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە ، بـەڵكو بگـەیت بـە پلـەو پایـەی چاكەكاران ،، وە لە قیامەتیشدا لە براوەكان بیت ، بەڵكو ئـاوات پـێ بـردن ( الغبطـة ) دروسـتە لـەكردەوە چـاكەكاندا وەكـو شـەونوێژ و ئـەوانی تـر ، لـە ( عبـدالله بـن عمـر )ـەوە – خـوای لـێ ڕازی بێـت – فەرمووی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویـەتی " لَا حَسَدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ رَجُلٌ آتَاهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ فَهُوَ يَتْلُوهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ ، وَرَجُـلٌ آتَـاهُ اللَّـهُ مَالًا فَهُوَ يُنْفِقُهُ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ "[١٥] ، واتە : ئاوات خوازی ذیـیە لـە دوو شـتدا نـەبێت یـەكێكیان كەسـێك خـوای گـەورە قورئـانی پێبەخشیوە ( واتە لەبەری كردووە ) ئەویش لە كاتەكانی شەو ڕۆژدا نوێژی پێوە دەكات ، وە ئـەوی تریشیان كەسێكە كە خـوای گـەورە

---

[١٥] رواه البخاري ( ٩ / ٧٣ فتح )

پارەو ماڵی پیٚ بەخشیوە ئەویش لەڕێگەی خوادا دەیبەخشێت لە كاتەكانی شەو ڕۆژدا

وە لە ( يزيد بن الاخنس )ـەوە – خوای لێی ڕازی بێت – كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " لا تنافس بينكم إلا في اثنتين رجل أعطاه الله قرآنا فهو يقوم به آناء الليل والنهار ، فيقول رجل لو أن الله أعطاني ما أعطى فلانا فأقول به كما يقوم فلان ورجل أعطاه الله مالا فهو ينفق منه ويتصدق فيقول رجل مثل ذلك "[١٦] ، واتە: كێبڕكیٚ و پێشبڕكیٚ نیە لە دوو شتدا نەبێت كەسێك خوای گەورە قورئانی پێبەخشیوە ئەویش لە كاتەكانی شەو ڕۆژدا نوێژی پیٚ دەكات ، و كەسێكی تر دەڵێت : ئەگەر خوا ئەوەی بە فلانەكەس بەخشیوە بە منیشی ببەخشایەت منیش وەكو فلانەكەس نوێژم پێوە دەكرد ، وە كەسێك خوای گەورە ماڵی پێبەخشیوە ئەویش لێی دەبەخشێت و (صدقە)ی لیٚ دەكات ، كەسێكیش هەمان قسەی پێشو دەكات

پێشەوا ( الحسن البصري ) – خوای لیٚ ڕازی بێت – دەڵێت : هیچ كردەوەیەك نازانین سەخت تربێت لە ناڕەحەتیەكانی شەو (شەونوێژ ) وە بەخشینی ئەم ماڵ و سامانە ،

---

[١٦] – قال المنذري في الترغيب ( ٢ / ٣٦ ) رواه الطبراني في الكبير ورواية ثقات مشهورون ورواه أبو يعلى من حديث أبي سعيد نحوه باسناجيد حسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب برقم (٦٣٦ ) ( ١ / ١٥٤ )

پاشان پێی وترا ئەی بۆچی ئەوانەی شەو نوێژ ئەکەن لە هەموو خەڵك دەم و چاویان جوان ترە ؟ ئەویش فەرمووی لەبەر ئەوەی تەنها لەگەڵ پەروەردگاردا بۆیە ئەویش ئەو نوورەی پیٚ بەخشیون

هەروەها ( الفضيل بن عياض ) دەڵێت ئەگەر نەتوانی بەشەو شەونوێژ بکەیت و بە ڕۆژیش بەڕۆژووبیت ئەوا بزانە کە (محروم)يت و تاوانەکان زۆر بوونە

وە بزانە خوابەنوری ئیمان دڵەکەت ڕوناك بکاتەوە کەوا شەونوێژی مارەیی حۆرییە چاو گەشەکانە ، وەهەر کەس کردەوەی زیاتر بکات ، زیاتری بۆ هەیە ، وە خواش پاداشتی زیاتری هەیە

هەروەها ( مالك بن دينار ) دەڵێت : شەوێکیان وێردەکەم لەدەس چوو و هەڵنەستام بۆ شەو نوێژ ، دەبینم لە خەودا ئەوە کچێکە بە جوانترین شێوەو پارچە کاغەزێکی بەدەستەوەیە و پێی وتم دەتوانیت بیخوێنیتەوە ؟ منیش وتم : بەڵێ ، ئەویش کاغەزەکەی بە من دا دەبینم تیایدا نوسراوە

أالهتك اللذائذ والإماني عن البيض الأوانس في الجنان

تعيش مخلدا لاموت فيها وتلهو في الجنان مع الحسان

تنبه من منامك إن خيرا النوم التهجد بالقرآن

واتە : ئایا خۆشی و خۆزگە و ئاواتەكانی دونیا سەرقاڵی كردوویت ( مشغول ) لە حۆریە سپیەیە هاودەمەكانی بەهەشت ، لەبەهەشتدا دەژیت بە هەتا هەتایی بە بێ مردن ، وە لەگەڵ حۆریەكاندا لەو بەهەشتانەدا ڕادەبوێرێت ، بێدار ببەوە لە خەوەكەت ، بەڕاستی لەخەو چاكتر شەونوێژ كردنە بە وە قورئان

هەروەها دەگێڕنەوە كە ( ازهر بن مغیث )كە یەكێك بووە لەوانەی بەبەردەوامی شەونوێژیان كردووە ( القوامین )ـە دەڵێت : لەخەومدا ئافرەتێكم بینی لە ئافرەتی دونیا نەدەچوو ، پێم ووت : تۆ كێیت ؟ ووتی حۆریم ، پێم ووت : شووم پێبكە ، ووتی: لەگەورەكەم داوام بكە و مارەییم بدە ، منیش ووتم : مارەییەكەت چییە ؟ ووتی: درێژی شەونوێژ .



## شەیتان مرۆڤ خامۆك وتەوەزل دەكات لەئەنجامدانی شەونوێژ

شەیتان زانای شەرو خراپەیە ، و ئەو چاك دەزانێت كە كاتێك بەندەیەك لە تاریكی شەودا بەتەنها لەگەڵ خوادا دەبێت ، وە عیبادەت لێی نزیك دەبێتەوە ، و هەردوو پێی ڕێك دەوەستێنێت لە گوێڕایەڵی ئەودا ، وە لە بەردەرگای خوادا كڕنووش دەبات ، ئەوا خوای گەورە ڕەتی ناكاتەوە ، بەڵكو وەری دەگرێت و و پلەو پایەی بەرز دەكاتەوە ، وئیمان و باوەڕی بەهێز دەكات ، جێگیر و دامەزراوی دەكات لەسەر ڕێگای ڕاست ، لەبەر ئەمانە هەمووی شەیتان ئەوپەڕی تێكۆشانی خۆی دەخاتە گەر بۆ تەمەڵ و تەوەزل كردنی مرۆڤ لە ئەنجامدانی شەونوێژ ، بۆیە ئەو سێ گرێ لە پشتی سەری ئادەمیزاد دەدات لەكاتی خەوتندا و لە شوێنی هەر گرێیەكدا ئەم ووتەیە دادەنێت : شەوێكی درێژت لەپێشدایە بنوو

لە ( أبي هريرة )ەوە – خوای لێ ڕازی بێت – كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: " يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ إِذَا هُوَ نَامَ ثَلَاثَ عُقَدٍ يَضْرِبُ عَلَى مَكان كُلَّ عُقْدَةٍ عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ ، فَإِنْ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ ، عُقْدَةٌ فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ ، وَإِلَّا أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ

كَسْلَانَ"[١٧] ، واتە شەيتان لە پشتی مللی هەر يەكێكتاندا كاتێك دەخەوێت سێ گرێ لێ دەدات و لە شوێنی هەر گرێيەكدا ئەمە دادەنێت شەوێكی درێژت لەپێشدايە بنوو ، ئەگەر هەستا لەخەو زيكری خوای كرد گرێيەك دەكرێتەوە ، ئەگەر دەست نوێژی گرت گرێيەك دەكرێتەوە ، و ئەگەر نوێژی گرت گرێيەك دەكرێتەوە ، ، بۆيە ئەو ڕۆژە چالاك و ڕۆح سووك دەبێت ، ئەگەر پێچەوانەش بوو ئەوا ڕۆح قورس و تەمەڵ دەبێت

پێشەوا ( النووي ) -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرمووێت زانايان بيرو بۆچونيان جياوازە دەربارەی ئەم گرێيانە( العقد ) ، ووتراوە ئەوە گرێی ڕاستەقينەيە بەمانایگرێی جادوو لێ كردنی مرۆڤ و بەستنەوەی لە هەستان بۆ شەونوێژ ، خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿ وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ ﴾ واتە وەلە شەڕی ئەو ژنە ساحيرانەی كە فوو دەكەن بە گرێكاندا ، لەسەر ئەم بۆچوونە ئەو گرێيانە ووتەيەكن شەيتان دەيڵێت و كاريگەريان هەيە لەسەر ساردكردنەوە ( خاوكردنەوە ) و تەمەڵ كردنی مرۆڤ هاوشێوەی كاريگەری جادوو

---

[١٧] - رواه البخاري ومسلم .

هـەروەها ووتـراوە   لەوانەیە كردارێك بێـت شـەیتان دەیكـات وەكو كرداری ئەو ژنە ساحیرانەكە فوو دەكەن بە گرێكاندا

وە ووتراوە   ( هو عقد القلب و تصميمة ) واتە : لـە سوربوون و جەخت كردنی دڵەوە هاتووە ، وەكو ئەوەی كە وەسوەسە لە دڵیدا دروسـت دەكـات و پێـی دەڵێـت : ئـەوە شـەوێكی درێـژت لەپێـشەو دواكەوە لە هەستان

هـەروەها وتـراوە   ئەمـە خوازەیـە ( مجـاز )ـە و ( كنايـە )یـە لـە خاوكردنەوەی شەیتان لە ئەنجامدانی شەونوێژ

پێـشەوا ( الحـافظ ) لـەكتێبی ( الفـتح ) دا دەفـەرمووێت   وە ووتەكـەی ( يـضرب ) واتـە   بەدەسـتی دەدات لـەو گرێیانـە بـۆ دڵنیابوون و قایم كردنی ئینجا ئەو قسەیە دەكات

وە ئەم سێ سیفەتە تەنها غافڵ و بێ ئاگا دەستی دەكەوێت كە بە بێ زیكر یان بەبێ خوێندنی ئایەتی ( الكرسي ) دەخـەوێت وە ئەگـەر كەسـێك بڵێـت   كـەگۆی فەرموودەكـە ( الفـظ الحـديث ) گـشتیيە( عـام ) بـۆ بـێ ئاگـا ( غافـڵ ) و جگـە لـەویش ، دەڵـێم بەڕاسـتی گـشتگیری ئـەم فەرموودەیـە تایبـەتكراوە ( مخـصص ) بـە فەرموودەكەی ( ابو هريرة ) كاتێك شەیتان پێی ووت :" إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ فَإِنَّه لاَ يَزَالَ عَلَيْـكَ مِـنْ اللَّـهِ حَـافِظٌ وَلَـا يَقْرَبَنَّـكَ

شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ " واتە ئەگەر چویتە سەر جێگاكەت ئەوا ئایەتی ( آية الكرسي ) بخوێنە چونكە لەلای خواوە پارێزەرێكت بۆ دێت و شەیتان نزیكت نابێتەوە هەتاوەكو ڕۆژ دەبێتەوە ، وە پێغەمبەریش ﷺ ( اقرار )ی كرد بەوتەكەی فەرمووی " صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ "[18] ، واتە ڕاستی پێی ووتی لەكاتێكدا خۆی درۆزنە

وە پێشەوا ( الحافظ ابن حجر ) لە كتێبی ( الفتح ) بۆ ئەم بۆچونە ڕۆیشتوە كە دەڵێت دەبێت بوترێت كە ئەمە تایبەتە بەو كەسەی كە ئایەتی ( آية الكرسي ) ناخوێنێت بۆ دەركردنی شەیتان.

پێشەوا ( النووي ) دەفەرمووێت مانای ( فأصبح نشيطا طيب النفس ) ئەوەیە كە چالاك دەبێت بە دڵشادبوونی بەوەی كە خوای گەورە سەری خستوە لە ئەنجامدانی عیبادەت و بەڵێنی پێداوە بە پاداشتەكەی ، لەگەڵ ئەوەی كە بەرەكەت دەخاتە نەفس و هەڵسوكەوتی و لە هەموو ئیش و كارەكانیدا ، لەگەڵ ئەوەی كە گرێ كانی شەیتان و تەوەزلێتی لەسەر لاداوە

هەروەها پێشەوا ( الحافظ ) دەفەرمووێت وە ئەوەی دەردەكەوێت ئەوەیە كە نوێژی شەو نهێنیەكی تێدایە لە ڕۆح سوكی ئەگەر چی ئەنجام دەری نوێژ هیچ لەواتاكانیشی تێ ناگات

---

18 - رواه البخاري ( ٤ / ٤٨٧ ) ، ( ٦ / ٣٣٥ ) ، ( ٩ / ٥٥ فتح ) معلقا تعليقا بجزوما به

منیش دەڵێم: وە ئەمە ڕاست و حەقەو هیچ كەسێك هەستی پێناكات مەگەر كەسێك نەبێت كە شیرینی شەونوێژی چەشتبێت و دڵەكەی ئارامی گرتبێت بە نزیكی لە خواوە لەم ساتە خۆشیانەدا ، چونكە ئەوە شیرینیەك لە دڵدا بەجێ دێڵێت كە ئەگەر بەندەیەك هەڵبژاردن بدرێتە دەستی لە نێوان ئەم شیرینیە و هەموو موڵكی دونیا بێ گومان ئەم شیرینیە هەڵدەبژێرێت

پێشەوا ( النووي ) دەفەرمووێت:

( إلا اصبح خبيث النفس كسلان ) واتە ئیلا روحی قورس و تەمەڵ دەبێت لەبەر ئەو گرێ یانەی كە شەیتان كە لەسەرێتی و كاریگەرە لەسەر خاوكردنەوە و دەست بەسەرگرتنیدا ، وەدەفەرموێت وە ڕووكەشی فەرموودەكە (ظاهر الحديث) ئەوە دەگەیەنێت كە كەسێك هەر سێ شتەكە كۆنەكاتەوە كە ئەوانیش زیكر و دەست نوێژ و نوێژكردنە ئەوا دەچێتە ڕیزی ئەوانەی كە ڕوح قورس و تەمەڵ دەبن

وە ئامانجی شەیتان لەمانە هەمووی ئەوەیە كە بەندە لەشەو نوێژ سارد و خاوبكاتەوە و تەمەڵ و تەوەزەلی بكات بۆ ئەوەی بەدرێژایی ڕۆژەكەی بەئاسانی بەسەریدا زاڵ بێت ، وە ئەوەش لە

فێڵە پیسەكانی شەیتانە كە لە مرۆڤی دەكات ، بەڵام چۆن ئەم فێڵانە پووچەڵ دەبێتەوە ؟ بەچەند شتێك :

١- دەست نوێژ گرتن پێش خەوتن لەبەر ئەو فەرموودەیەی كە لە ( الصحیحین )دا هاتووە كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ( البراء بن عازب )ی فەرموو " إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ "[19] ، واتە ئەگەر هاتیتە سەر جێگەكەت ئەوا دەست نوێژ بگرە وەكو چۆن دەست نوێژ بۆ نوێژ دەگریت

٢- نوێژی ( الوتر ) ئەنجام بدەیت پێش خەوتن ئەگەر لەوە ترسایت كە بەئاگا نەیەیت بۆ شەونوێژ بەڵام ئەگەر لەسەر ئەوە ڕاهاتبویت كە لە شەودا هەستیت بۆ نوێژ ئەوا ئەمە چاكتر و جوانتر و باشترە ، ( ابن عمر ) - خوا لە خۆی و باوكی ڕازی بێت- دەفەرمووێت : هیچ كەسێك نیە ڕۆژی بەسەردا بێت و شەوەكەی نوێژی ( الوتر )ی نەكردبێت ئیلا لەسەر سەریەوە گورسێك هەیە كە بەقەدەر حەفتا باڵە ، وە ( الجریر ) ئەو گورێسەیە كە لەغاوی وشتری پێ دەكرێت ، وەكو بڵێیت شەیتان لەغاوی كردووە سەری گورێسەكەی بەدەستەوەیە و بۆ هەرچی شوێنێكی بوێت دەیبات

---

[19] - رواه البخاري ومسلم

٣- هەر دوو دەستت كۆدەكەیتەوە پێش خەوتن و ( المعوذتين ) واتە ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴾ و ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴾ی تێدا دەخوێنیت ئینجا فووی پێدا دەكەیت و چەندت پێكرا دەست بەسەر جەستەتدا دەسڕیت ، وە بەسەرت دەست پێ بكە وە ئەمە جێگیرە لە ( صحيح البخاری ) لە فەرموودەی عائیشە خوای لێ ڕازی بێت (مرفوعا )[20]

٤- دوو ئایەتی كۆتایی ( سورة البقرة ) بخوێنە لەبەر ئەو فەرموودەیەی كە لە (الصحيحين) داهاتووە لە ( أبي مسعود الانصاري )یەوە - خوای لێ ڕازی بێت - كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " الْآيَتَانِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مَنْ قَرَأَهُمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ "[21] ، واتە دوو ئایەتی كۆتایی لە ( سورة البقرة ) هەر كەسێك بیانخوێنێت لەشەوێكدا كیفایەتێتی ( بەسن )

پێشەوا ( النووي ) دەڵێت ووتراوە مانای (كفتاه) واتە بەسێتی لە شەیتان ، وە دەڵێن: بەسێتی لە هەموو ئافات و تەنگ و چەڵەمەیەك ، وە لەوانەیە هەموو ئەو مانایانە بگرێتەوە

---

[20] - البخاري ( ١١ / ١٢٥ فتح )

[21] - البخاري ومسلم

پێشەوا ( ابن القيم ) - ڕەحمەتی خوای لێ بێت - دەفەرمووێت بۆچونی ڕاست لە ڕاڤەی ( كفتاه ) ئەوەیە بەسێتی لە شەڕ و خراپەی هەموو ئەو شتانەی زیانی پێ دەگەیەنن

٥- خوێندنەوەی سورەتێك لە قورئان لەبەر ئەو فەرموودەیەی ( أحمد و الترمذي ) بەمەڕفوعی ڕیوایەتی دەكەن لە شداد بن اوس - خوای لێ ڕازی بێت - كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " ما من أمريء مسلم يأخذ مضجعه فيقرأ سورة من كتاب الله إلا بعث الله ملكا يحفظه من كل شيء يؤذيه حتى يهب "[22]

واتە هیچ كەسێكی موسوڵمان نییە كە هاتە سەر جێگەكەی و سورەتێك لە قورئان بخوێنێت ئیلا خوای گەورە فریشتەیەكی بۆ دەنێرێت بیپارێزێت لە هەموو شتێك زیانی پێ بگەیەنێت هەتا وەكو لەخەو هەڵدەستێت.

٦- خوێندنەوەی ( آية الكرسي ) بە جوانی و بیركردنەوە لە ماناكەی چونكە دەتپارێزێت لە شەیتان هەتاوەكو ڕۆژ دەبێتەوە وەكو پێشتر باس كرا

---

[22] - رواه الترمذي ( ٥ / ١٤٢ ) وأحمد وحسنه الحافظ في تخريج الأذكار ، ضعفه الألباني في ضعيف الترغيب والترهيب برقم : ٣٤٥ ( ١ / ٨٩ ) .

٧- (٣٣) جار (سبحان الله) و (٣٣) جار ( الحمد الله ) و (٣٤) جار ( الله اكبر ) بكە لەكاتی خەوتندا كە ئەویش جێگیر و (صحیح)ـە لە فەرموودەی (علي بن ابي طالب ) لە ( الصحيحين) دا

٨- بەلای ڕاستتدا بخەوە و بڵێ " بِاسْمِك رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِك أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَك الصَّالِحِينَ "[٢٣]

٩- ئینجا بڵێ " بِسْمِ اللهِ وَضَعْتُ جَنْبِي، اللهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي وَأَخْسِئْ شَيْطَانِي، وَفُكَّ رِهَانِي، وَاجْعَلْنِي فِي النَّدِيِّ الأَعْلَى "[٢٤]

١٠- ئینجا یادی ( زیكری )خوا بكە هەتاوەكو خەوت لێ دەكەوێت ، لە ( جابر )ـەوە - خوای لێ ڕازی بێت - فەرمووی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی ئەگەر كەسێك چووە سەر جێگەی فریشتەیەك و شەیتانێك ڕووی تێ دەكەن ، و فریشتەكە دەڵێت بەخێر و چاكە كۆتایی بەكارەكانت بێنە ، ئەگەر یاد و زیكری خوای كرد هەتاوەكو خەوی لێدەكەوێت ئەوا فریشتەكە شەیتانەكە دەردەكات و خۆی پارێزگاری لێ دەكات ، وەئەگەر لەخەویش هەستا فریشتەیەك و شەیتانێك ڕوی تێ دەكەن

---

[٢٣] - البخاري ومسلم

[٢٤] - قال النووي في الأذكار ( ٧٧ ) رواه أبو داود باسناد حسن ، صححه الألباني المشكاة (٢٤٠٩ ) وصحيح وضعيف ابي داود برقم ( ٥٠٥٤ ) ( ١١ / ٥٤ ) وصحيح الجامع الصغير (٤٦٤٩ )

**فریشتەكە دەڵێت بەخێر و چاكە دەست پێبكە ، و شەیتانەكەش دەڵێت بەشەڕ و خراپە دەست پێبكە و ئەگەر ووتی** الحمد لله الذي أحيا نفسي بعد موها ، و لم يمتها في منامها ، الحمد لله الذي يمسك التي قضى عليها الموت ويرسل الأخرى إلى أجل مسمى ، الحمد لله الذي يُمْسكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ أَنْ تَزُولا وَلَئِنْ زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ' الحمد لله الذي يمسك السماء أن تقع على الأرض إلا بإذنه " **ئەوا فریشتەكە شەیتانەكە دەردەكاتەو خۆی پارێزگاری لیٚ دەكات**



## گاڵتەکردنی شەیتان بەو کەسەی کە شەونوێژ پشت گوێ دەخات

ئەگەر شەیتان بەسەر بەندەیەکدا زاڵ بوو هەتاوەکو وای لێ کرد بە درێژی شەو بخەوێت هەتاوەکو دەرکەوتنی سپێدە ( الفجر ) دەردەچێت ، ئەو کاتە گاڵتەی پێ دەکات ، و بەکەم و سووکی دەزانێت و میزدەکات بە گوێکانی بۆ ئەوەی کەڕیان بکات لە بیستنی خێروچاکە ، و کارتێکردنی ئامۆژگاریەکان ، وە بۆ ئەوەی دەرگاکانی زانست و دانایی لێ دابخات

لە ( عبدالله بن مسعود ) – خوای لێ ڕازی بێت – فەرمووی باسی پیاوێك کرا لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە تاوەکو بەیانی خەوتووە ، ئەویش فەرمووی ئەوە پیاوێکە شەیتان میزی کردووە بە گوێیدا یان بە گوێیەکانیدا

پێشەوا ( الحافظ) دەفەرمووێت وە بۆ چوونەکان جیاوازە دەربارەی ڕاڤەی ( بول الشیطان ) واتە میزی شەیتان ، هەندێك دەڵێن ئەوە لەسەر ڕاستیەکەیەتی (واتە میزی ئاسایی )یە

( القرطبي ) و جگە لەویش دەفەرموون هیچ ڕێگرێك نی‌یە لەوە چونکە شتێکی مەحاڵ نی‌یە ، چونکە جێگیر بووە کە شەیتان دەخوات و دەخواتەوە و جووت بونیش دەکات بۆیە هیچ ڕێگرێك نی‌یە لەوەی میزیش بکات

وە هەندێکیش دەڵێن ئەوە ( کنایە )یە لە داخستنی شەیتان بۆ گوێی ئەو کەسە کە دەخەوێت و نوێژ ناکات بۆ ئەوەی گوێی لە زیکر نەبێت ، وە هەندێکیش دەڵێن ئەوە (کنایە)یە لە بەکەم زانینی شەیتان و سوکایەتی کردن بەو کەسە

وەهەندێکی تریش دەڵێن : ئەوەیە کەشەیتان دەست دەگرێت بەسەریدا و زاڵ دەبێت ، و سووکایەتی پێ دەکات هەتاوەکو دەیگات بەوشوێنەی کە تایبەتە بە میزکردن ( واتە ئاودەست ) ، چونکە عادەتی ئەو کەسەی کە سووکایەتی بە شتێك بکات ئەوەیە کە میزدەکات بەسەریدا

ئیمامی احمد لە ( الحسن البصري )یەوە ڕیوایەت دەکات کە فەرموویەتی سوێند بەخوا میزەکەی زۆر قورسە ، وە ( ابن مسعود) -خوای لێ ڕازی بێت - دەفەرموێت بەسە زەرەروزیان و خراپە بۆ ئەو کەسەی کە تاوەکو بەیانی دەخەوێت و شەیتان میزی کردبێت بە گوێدا

## خۆشەویسترین شەونوێژ لای خوای گەورە

بەڕاستی خوای گەورە ئیشی چاكەی خۆش ئەوێت – خۆشەویستێك كە شایستەی بەرزی و گەورەیی خودایە– وە بەندەی چاكەكاری خۆش دەوێت ، ئەو بەندەیەی خۆش دەوێت كە لەتاریكی شەودا هەڵدەستێت بە زەلیلی و كزۆڵی نوێژ دەكات ، بەڵام خوای گەورە خۆشەویستیەكی زیاتری هەیە بۆ شێوازێكی تایبەتی شەونوێژ ، هەروەكو پێغەمبەری خوا ﷺ باسی كردووە بۆمان لە (عبدالله بن عمر و بن عاص )ـە وە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " أَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ ، وَأَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ ، كَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا ، وكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ وَيَنَامُ سُدُسَهُ "[٢٥] واتە خۆشەویسترین ڕۆژووی سوننەت لای خودا ڕۆژووی (داود)ـە علیە السلام ، وە خۆشەویسترین نوێژی سوننەت نوێژی ( داود )ـە ، كە ڕۆژێك بە ڕۆژوو دەبوو ڕۆژێكیش بە ڕۆژوو نەدەبوو ، وە شەونوێژەكەی بەو شێوەیە بوو كە تاوەكو نیوەی شەو دەخەوت ( دەنوست ) ، پاشان لە سێیەكی شەوەكەش نوێژی دەكرد و شەش یەكیشی دەنوستەوە ، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت كە ئەگەر گریمان نوێژی شێوان ( العشاء )كاتژمێر هەشت و نیو دەبێت

[٢٥] – رواه الستە إلا الترمذي

، وە نوێـژی بـەیانیش کاتـژمێر پێـنج بێـت ، ئـەوا ڕاسـتەوخۆ دوای نوێژی (شێوان ) عیشا دەنوێت ( دەخەوێت ) واتە نزیکەی کاتـژمێر نـۆ ئینجا نزیـك کاتـژمێر یەکی شـەو هەڵدەسـتێت و نوێـژ دەکـەیت نزیکـەی دوو کاتـژمێر و نیـو پاشـان نزیکـەی کاتـژمێر سـێ و نیـو دەنویـت ( دەخـەوێت )و پـێش نوێـژی بـەیانی بەچـەند دەقەیـەك هەڵدەسـتێت بـۆ ئـەوەی پـێش نوێـژی بەیانی بەچـەند دەقیقەیـەك بەخەبـەر بێیتـەوە و نوێـژی بـەیانیت بەسـەردا نەیـەت و تـۆش خەوتبیت ، **سودەکانی ئەم ڕێگەیە :**

١- موسوڵمان بە ئاگایە و هەڵدەستێت بۆ نوێژی بەیانی

٢- بەردەوامی شەونخونی تاوەکو نوێژی بەیانی وا لـە ڕوخسار دەکات کە زەرد هەڵگەڕێت ، بەڵام ئەگەرمرۆڤ پێش نوێـژی بەیانی هەندێك خەوت ئەوا ئەو زەردییەی ڕوخساری نامێنێت هیلاکیەکەی لەسەر سووك دەبێتەوە

٣- کاتێك موسوڵمان دوای شەونوێژ دەنوێت ( دەخەوێت ) ئـەوا کـات و شـوێنێکی گونجـاوە بـۆ ( الرؤيـا الـصالحة ) واتـە : خـەونی چاکە ، وە خـەونی چاکەیش مژدەیەکـە لەلایـەن خـواوە بـۆ بەنـدەی ئیماندار ، لە ( ابو هريـرة ) - خوا لێـی ڕازی بێـت - لـە پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرموویەتی " الرُّؤيَـا الـصَّالِحَةُ بُـشرى مِـنَ اللَّـهِ "[٢٦]، واتـە : خـەونی چاکە مژدەیەکی خۆشە لەلایەن خواوە

---

[٢٦] - البخاري ومسلم

# ژمارەی ڕكاتەكانی شەو نوێژ

شەو نوێژ بە دەست دێت ئەگەر بە دوو ڕكاتیش بێت هەر وەكو ( ابن عباس ) لە راڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ﴿ وَالَّـذِينَ يَبِيتُـونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًـا ﴾ دەفەرموویت هەرچ كەسێك دوو ڕكات یان زیاتر لە دوای نوێژی خەوتنان ( العشاء ) بكات ئەوا لەوكەسانەیە كە بەشەوهەستاوە و سوژدەی بۆ خوا بردووە[٢٧]

وە لە( فضالة بن عبيد ) و ( تميم الداري ) – خوایان لێ ڕزی بێت – كەپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " من قرأ عشر آيات في ليلة كتب له قنطار ، والقنطار خير من الدنيا وما فيها ، فإذا كان يوم القيامة يقول ربك عز وجل اقرأ وارق بكل آية درجة حتى ينتهي إلى آخر آية معه ، يقول الله عز وجل للعبد اقبض ، فيقول العبد بيده يا رب أنت أعلم ، يقول بهذه الخلد وبهذه النعيم "[٢٨]

واتە هەركەسێك دە ئایەتی لە شەوێكدا بخوێنێت ئەوا (قنطار )ێكی بۆ دەنوسرێت ، وەهەر ( قنطار )یكیش لە دنیا و

---

[٢٧] – تفسير القرطبي ( ١٣ / ٧٢ )

[٢٨] – قال الهثمي في المجمع ( ٢ / ٢٦٧ ) رواه الطبراني في الكبير والأوسط وفيه إسماعيل بن عياش لكنه من روايته عن الشاميين وهي مقبولة مقبوله أ.هـ

قلت قبلها أحمد بن حنبل ويحيى بن معين والنسائي وغيرهم كما ذكر ذلك الحافظ في التهذيب (١ / ٣٢١ ) وبهذا يكون الحديث حسنا ، وحسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب برقم (٦٣٨ )

ئەوەی تیایەتی چاكتر و خێرترە ، وە كاتێك كە ڕۆژی قیامەت هات پەروەردگار ( عزوجل ) دەفەرمووێت بخوێنەو بەرز بەرەوە بە هەر ئایەتێك پلەیەك هەتاوەكو دەگەیتە كۆتا ئایەتێك كەلەبەرت كردووە ، خوای گەورە بە بەندەكە دەفەرمووێت : بەندەكەش بەدەستی ئاماژە دەكات و دەڵێت پەروەردگارا تۆ زاناتریت دەفەرموێت: بەمەیان نەمریە ، و بەوەشیان خۆشی نەبڕاوەیە

وە لە ( أبي سعيد الخدري ) – خوا لێی ڕازی بێت – فەرموویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :" إِذَا أَيْقَظَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ مِن اللَّيْلِ فَصَلَّيَا رَكْعَتَيْنِ جَمِيعًا كُتِبَا فِي الذَّاكِرِينَ وَالذَّاكِرَاتِ"[٢٩]

واتە : ئەگەر پیاو خێزانەكەی بەشەو بەئاگا هێناوە ودوو ڕكات نوێژیان پێكەوە كرد ئەوا لەو كەسانە دەنوسرێت كە زۆر زیكرو یادی خودا دەكەن

وە لەبەر ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ هانی پیاو دەدات خێزانەكەی بە ئاگا بهێنەوە و ئافرەتیش پیاوەكەی بە ئاگا بهێنێتەوە بۆ شەو نوێژ و دوعای بۆ ئەوەیان كردووە كە ئەوەی تریان بەئاگا دێنێتەوە بەڕەحمەت ، ( أبو هريرة ) – خوا لێی ڕازی

[٢٩] – رواه أبو داود ( ٢ / ٣٣ ) باسناد حسن ، وصححه الألباني في صحيح أبي داود برقم (١١٦١ ) ١ / ٢٤٣ والمشكاة برقم ( ١٢٣٨ ) ١ / ٢٧٥

بێت – دەفەرمووێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:" رَحِمَ اللَّهُ رَجُلا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّى وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ ، فَإِنْ أَبَتْ نَضَحَ فِي وَجْهِهَا الْمَاءَ ، وَرَحِمَ اللَّهُ امْرَأَةً قَامَتْ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّتْ وَأَيْقَظَتْ زَوْجَهَا ، فَإِنْ أَبَى نَضَحَتْ فِي وَجْهِهِ الْمَاءَ"[٣٠]

واتە رەحمەتی خوا لە پیاوێك بەشەو هەستا شەونوێژی كرد و خێزانەكەشی بەئاگا هێنایەوە وە كە ئەگەر هەڵنەسا چەند پرژە ئاوێكی كرد بە دەم و چاویدا ، رەحمەتی خوا لە ئافرەتێك بەشەو هەستا شەونوێژی كرد و مێردەكەشی بەئاگا هێنایەوە وە كە ئەگەر هەڵنەسا چەند پرژە ئاوێكی كرد بە دەم و چاویدا



[٣٠] – رواه أبو داود ( ٢ / ٣٢ ) باسناد صحيح، وصححه الألباني في صحيح سنن أبي داود برقم ( ١١٦٠)

## چەند دیمەنێك لە شەونوێژی پێشینی پیاوچاكان
## - ڕەحمەتی خوایان لێ بێت -

١- لە ( انس )ەوە - خوا لێی ڕازی بێت - فەرمووی : " دَخَلَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمَسْجِدَ فَإِذَا حَبْلٌ مَمْدُودٌ بَيْنَ السَّارِيَتَيْنِ فَقَالَ مَا هَذَا ؟ فَقَالُوا هَذَا حَبْلٌ لِزَيْنَبَ تَطرَد عَنْ نفسهَا النعاس ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : حُلُّوهُ ، لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ فَإِذَا فَتَرَ فَلْيَرْقُدْ "[٣١]

واتە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مزگەوتەوە و بینی كەوا گورێسێك هەڵواسراوە لە نێوان دوو كۆڵەكەدا ، فەرمووی ئەمە چیە ؟ ووتیان ئەم گورێسە هی زەینەبە خەو لە خۆی دەڕەوێنێتەوە ، فەرمووی بیكەرەوە باوەكو كەسێكتان تاوەكو چالاكەو توانای هەیە نوێژ بكات و كە توانای نەما با بخەوێت ، وەلەم فەرموودەیەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە كە پێشینی چاكەكار تا چ ڕادەیەك تێكۆشاون ئەوەتا دایكی ئیمانداران زەینب- خوا لێی ڕازی بێت - گورێسێك دەبەستێت بەدوو كۆڵەكە لە كۆڵەكەكانی مزگەوتەوە و شەو نوێژ دەكات و كاتێك خەوەنوتكە بیبردایەتەوە هەڵدەستاو خۆی هەڵدەواسی بەم گورێسەوە بۆ ئەوەی خەوەكەی بڕەوێتەوە

---

[٣١] - متفق عليه

٢- وەلە ( عبد الله ابي بن قيس )ـەوە دەفـەرمووێت  ڕۆشتم بـۆ لای دايكـی ئيمانـداران ( عائيـشة ) - خـوای لـیٚ ڕازی بێـت - فــەرمووی  ئــەی عبــد الله واز لــە شــەونوێژ مەهێنــە ، چــونكە پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـەرگيز وازی لـیٚ نـەهێنا، وە كاتێك نـەخۆش يان بیٚتوانا ببوايە ئەوا بەدەنيشتنەوە نوێژی دەكرد

٣- وەهەروەها لە ( عبد الله بن قيس )ـەوە كەوا پرسيار كرا لە دايكی ئيمانداران ( عائيشة ) - خوای لیٚ ڕازی بێت - كردووە ئايا پێغەمبـەری خوا ﷺ بـەدەنگی بـەرز شـەونوێژی دەكرد يان بـە نهێنی ؟ فەرمووی  هەمووئەوانەی دەكرد

٤- وەلە ( مستدرك الحاكم بسند صحيح ) كەوا پێغەمبـەری خـوا ﷺ تـیٚ پـەڕی بـەلای ابـو بكـر- خـوای لـیٚ ڕازی بێـت - شەونوێژی دەكرد و دەنگی نزم كردبوەوە ئينجا بەلای عمر- خوای لیٚ ڕازی بێت - تێپـەری نوێـژی دەكـرد و دەنگـی بـەرز كردبووەوە و پرسياری لە ( ابو بكر ) كرد ووتـی  ئـەی پێغەمبـەری خوا ﷺ  وام كردووە كە ئەوەی موناجاتی دەكـەم دەنگم دەبيسێت ، و پرسـياری لە عمر كرد ووتی  بۆ ئەوەی شـەيتان ڕاو بنێم و خـەوتوان بـە ئاگـا بێنمـەوە ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە ابو بكری فـەرموو : هـەندێك دەنگـت بەرز بكەرەوە بە عمريشی فەرموو: هەندێك دەنگت نزم بكەرەوە

٥- وەلە ( موطأ الامام مالك ) لە عبد الله بن عمر - خوایان لێ ڕازی بێت - فەرمووی عمر بەشەو شەونوێژی دەكرد هەتاوەكو دەگەیشتە كۆتای شەو ئەو كات خێزانەكەی بە ئاگا دەهێناو ئەم ئایەتەی دەخوێند كاتێك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى ﴾

٦- وەلە ( صحيح البخاري و مسند احمد ) لە ( ابي عثمان النهدي )یەوە فەرمووی: لە ماڵی ( ابو هريرة ) حەوت شەو میوان بووم بینیم خۆی و خێزانەكەی و خزمەتكارەكەی شەویان كردبوو بە سێ بەشەوە خێزانەكەی سێ یەكێك ، و خزمەتكارەكەی سێ یەكێك و ( ابو هريرة )ش سێ یەكێك

٧- وەلە ( تذكرة الحفاظ ) ( للذهبي ): كەوا ( سليمان التيمي) دوو خێزانی هەبووە لەگەڵ خێزانەكانیدا شەویان دەكرد بە سێ بەشەوە

٨- وە ( الحسن بن صالح وهو من رجال مسلم ) خۆی و براكەی و دایكی شەویان دەكرد بە سێ بەشەوەو ، كاتێك كە دایكی مرد خۆی و علی برای شەویان دەكرد بە دوو بەشەوەو كە براكەی مرد خۆی بەتەنها شەونوێژی دەكرد

٩- وە ( الحسن بن صالح )ـە كەنیزەكێكی هەبوو و فرۆشتی و لەشەودا خاوەن ماڵەتازەكەی لەخەوهەڵساند ووتیان نوێژی بەیانیە ؟ ووتی نەخێر ، ئەی شەونوێژ ناكەن ؟! ووتیان ئێمە هەڵناسین بۆ نوێژی بەیانی نەبێت و ئەویش هات بۆ لای ( الحسن ) بەگریانەوە ، ووتی بمگەڕێنەوە تۆمنت فرۆشتوە بە كەسانێك نوێژە فەرزەكان نەبێت هیچ نوێژێك ناكەن ئەویش گەڕاندیەوە

١٠- ( محمد بن واسع ) كاتێك كە شەو دادەهات هەڵدەستاو شەونوێژی دەكرد ، خێزانەكەی دەڵێت حاڵی وەكو حاڵی كەسێك وابوو كە هەموو خەڵكی ئەم دنیایەی كوشتبێت

١١- ( ابو سليمان الداراني ) دەفەرموویت سوێند بەخوا ئەگەر شەونوێژ نەبێت حەزم لەم دنیایە نەدەكرد ، سوێند ئەوانەی لەشەودا شەونوێژ دەكەن لەتام و چێژێكی زۆر خۆشتردان لەوانەی كەلەگەمەو گاڵتەو ڕابواردندان ، وە بەڕاستی چەند ساتێك بە سەر دڵدا تێدەپەڕێت كە تیایدا دڵ سەما دەكات بە خۆشی یادی خوا ، ئەو كات دەڵێم ئەگەر بەهەشتیەكان لەخۆشیەكی ئاوەها دا بن ئەوا بە ڕاستی لە خۆشیەكی زۆر گەورەدان

١٢- ( رياح بن عمرو القيسي ) كە یەكێكە لە تابعیە بەرزەكان ژنێكی هێنا كە ناوی ( ذؤابة ) بوو كاتێك كە ڕۆژ بویەوە

ویستی تاقی ئەم ئەم ئافرەتە بكاتەوە بینی كەوا هەویر دەشێلێت پێی ووت : كەنیزەكێكت بۆ نەهێنم ؟ ئەویش ووتی: من مێردم بە ریاح كردووە نەوەك ستەم كارێكی مل هوڕ ، وەكاتێك شەو داهات (ریاح ) خۆی كرد بەخەوتوو و ئافرەتەكەی هەستاو چارەكێكی شەو شەونوێژی كرد و ووتی ئەی ریاح هەستە ، ئەویش ووتی: هەڵدەستم ، وەلەناو جێگەكەی هەڵنەستاو خەوت ، وەچارەكی دووەمی شەویش نوێژی كرد و ووتی: ئەی ڕیاح هەستە ، ئەویش ووتی : هەڵدەستم لەناو جێگەكەی هەڵنەستاو خەوت ، وە چارەكی سێیەمیش بەسەر چوو ، ووتی: ئەی ریاح هەستە ئینجا لە چارەكی چوارەمی شەودا ووتی : ئەی ریاح سەربازەكان مۆڵگەی خۆیانیان ئامادەكرد و چاكەكاران سەرفراز بوون ، خۆزگە دەمزانی كێ منی هەڵخەڵەتاند بە تۆ ؟! وە ئەم ئافرەتە كاتێك شەو بهاتایە بەجوانترین شێوە خۆی دەڕازاندەوە ئەگەر مێردەكەی پێویستی پێی بوایەت لەگەڵی دەبوو، دوای ئەوە خۆیان سەرقاڵ دەكرد بە عیبادەت كردنەوە

**١٣- ( ابـو اسـحاق الـشيرازي ) كاتێـك شـەو دادەهـات هەڵدەستاو موناجاتی خوای دەكرد و دەیووت**

لبست ثوب الرجا والناس قد رقدوا

وقمت أشكو إلى ملاي ما أجد

وقلت ياعدتي في كل نائبه

ومن عليه في كشف الضر أعتمد

أشكو إليك أمورا أنت تعلمها

مالي على حملها صبر ولا جلد

وقد مددت يدي بالذل معترفا

إليك ياخير مامدت إليه يد

فلا تردها يارب خائبة

فبحر جودك يروى كل من يرد

**دوبارەی دەكردەوەو دەگریا**

**١٤- دەگێڕنەوە كەوا ( مالك بن دينار ) شەوێك هەتا بەیانی ئەم ئایەتەی دوبارە دەكردەوە كاتێك خوای گەورە دەفەرموێت :**

﴿أَمْ حَسبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾

١٥- لە ( زائدة )ـەوە دەڵێت لەگەڵ ( ابو حنيفة ) لـە مزگـەوت نوێـژی عیـشام کـرد وخـەڵکی هـەمووی لـە مزگـەوت چـونە دەرەوە و نەیزانی من لە مزگەوتم ، و وويستم دەربارەی مەسەلەیەك پرسیاری لـیّ بکـەم بـە شـێوەیەك کەکـەس پـێم نـەزانێت ، هەسـتاو دەسـتی بـە خوێندنەوەی قورئان کردو نوێژی دەست پێکرد هـەتاوەکو گەیـشتە ئەم ئایەتە ﴿ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَـذَابَ الـسَّمُومِ ﴾ وە لـە مزگـەوت مامـەوە چـاوەڕوانم دەکـرد نوێـژ تـەواو بکـات وە ئـەم ئایەتـەی هـەر دووبارە دەکردەوە هەتاوەکو بانگی بەیانی دا



## چاكەی عیبادەتی شەو لەسەر عیبادەتی ڕۆژ

١- پەرستشی ( عیبادەتی ) شەو بەزۆری ( اخلاص )ی تێدایە ، چونكە بەندە لەتاریكی شەودا هەڵدەستێت و كەس نایبینێت ، لە ( ابو هريرة ) - خوای لێ ڕازی بێت - فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: " أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ وَأَفْضَلُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلاَةُ اللَّيْلِ "[٣٢] ، واتە چاكترین ڕۆژو لەدوای ڕۆژووی ڕەمەزان ڕۆژووی مانگی خوایە محرم ، چاكترین نوێژیش لەدوای نوێژە فەرزەكان شەونوێژە

٢- پەرستشی ( عیبادەت ) شەو لەسەر نەفس قورسە و كۆشش تیایدا زیاترە ، بۆیە پاداشت تێدا گەورەترە هەر وەكو خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْءًا وَأَقْوَمُ قِيلًا﴾ واتە ئەو پەرستشەی كە لەشەودا ئەنجام دەدرێت كاریگەرترە لەدڵ ، و ووتە ئاشكراترە بۆ یەكلابوونەوەی دڵ لەسەرقاڵیەكانی دونیا ، وە ئەگەر مرۆڤ كۆششی كرد لەگەڵ نەفسی خۆیدا لە پێناوی خوادا ئەوا خواش ڕێنمووی دەكات بۆ سەر ڕێگای ڕاست ، وەبەرزی دەكاتەوە بۆ پلەی چاكەكاران هەر وەكو خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ

[٣٢] - رواه مسلم ( ٨ / ٥٤ نووي )

الْمُحْسِنِينَ ﴾ ، واتە ئەوانەی تێکۆشاون لە پێناوماندا ڕێنموویيان دەکەين بۆ ڕێگەکانمان ، وە خوای گەورە لەگەڵ چاکەکاران و پشتيوانيانە

٣- پەرستشی ( عيبادەتی ) شەو تێڕامان و تێگەيشتن و بيرکردنەوەيەکی زياتری تێدايە ، چونکە مێشك بەتاڵە و هيچ ئيش و کارێکی تێدا نىيە ، بۆيە دڵ و زمان پێکەوە هاوجووتن ( متفقن ) لەسەر تێفکرێن ( تدبر ) و تێ گەيشتن

٤- شەو وەرزی داباريني ڕەحمەت و دابەزينی خوای زەوی و ئاسمانەکانە ، بۆيە عيبادەت تێدا گەورە دەبێت ، وە ئەم شوێنەوارە گرنگەشی هەيە لەسەر نەفس چونکە کاتێکی چاکە

٥- عيبادەتی شەو چەندين پلە مرۆۋ بەرزدەکاتەوە ، چونکە دووشت پێکەوە کۆدەکاتەوە بەتاڵ بوونی دڵ لە هەموو خراپەکاريەك ئەويش بە لێ خۆش بوونی تاوانەکان ، وە ڕازاندنەوەی بەدەست کەوتنی چاکەکان

## سودەكانی شەو نوێژ

١- بەڕاستی ئەگەر بەندە لە شەودا هەستا و پێیەكانی ڕێك كرد بۆ پەروەردگاری بە زەلیلی و كزۆڵی ، ئەوا ڕاوەستانی ڕۆژی قیامەتی لەسەر ئاسان دەبێت كە هەموو خەلك وەستاون لەبەردەم (رب العالمین ) ، وە هەركەسیش لێرەدا ئارام و واستراحەت بووبێت لەویٚ هیلاك دەبێت و پادشت لە ڕەگەزی ( جنسی ) كردەوەیە

٢- هەر كەسێك شەونوێژی زۆر بكات لە پیاوان بێت ئەوا خوای گەورە حۆرییە چاوگەشەكان دەكات بە خێزانی لە بری ئەوەی كە وازی لە جێگەی ( نووین ) و خێزانی جوانی هێناوە و خەریكی عیبادەتی پەروەردگاری زەوی و ئاسمان بووە

٣- تەندروستی جەستەی ئەو كەسەی شەونوێژ دەكات و بیٚ گەردی و پاكی ڕۆحی و درەوشانەوەی دەم و چاوی ، بە ( الحسن البصري ) - ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت - ووترا : بۆچی ئەوانەی شەو نوێژدەكەن جوانترین دەم و چاویان هەیە ؟ ئەویش فەرمووی لەبەر ئەوەی بەتەنها لەگەڵ خواكەیان دا بوون بۆیە لە نوری خۆی پیٚ بەخشین

٤- كردنەوەی گریٚ كان و سەركەوتنە خوداییەكان و ئیلهامە گەورەكان هەموویان بەهۆی شەونوێژەوە بەدەست دێن ، هەر وەكو

خوای گەورە دەفەرموویێت :﴿ وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ ﴾ ، واتە : ئەوانەی تێكۆشاون لە پێناوماندا ڕێنموویيان دەكەین بۆ ڕێگەكانمان

( سري السقطي ) دەڵێت ( سوودەكان لە تاریكی شەودا دێن ) ، وەچەند زانا تێگەیشتنی بۆ مەسەلەیەك لێ داخرابوو و هەستاو موناجاتی لەگەڵ خودای خۆیدا كرد لە تاریكی شەودا و هەموو دەرگاكانی تێگەیشتنی بۆ كردۆتەوە ، وە ئەو شتەی كە زۆر قورس و ناڕەحەت بوو پێشتر بۆی ئاسان كرد

٤- وە خوای گەورە دڵی شەونوێژكەران شاد و خۆش دەكات بە بینینی ( وجهه الكريم ) لە ڕۆژی قیامەت

پێشەوا ( الحسن البصري ) - ڕەحمەتی خوای لێ بێت - دەفەرموویێت: ئەگەر عابیدەكان بزانن كە خوا نابینن ئەوا دەتوێنەوە.

## ئادابەكانی شەونوێژ

١- پێش نووستن دەست نوێژ بگرەو نییەتی ئەوەت هەبێت كە هەلسیت بۆ شەونوێژ ، چونكە ئەوەتا یەكێك لەهاوەلآن دەفەرمووێت بەڕاستی من بەتەمای پاداشتی نووستنەكەمم هەروەكو چۆن بەتەمای شەونوێژەكەمم

٢- نییەتی ئەوەت هەبێت لەنووستنەكەت كەوا پشوویەك وەربگریت بۆ ئەوەی بتوانیٚ هەستیت بۆ شەونوێژ ئەوا پاداشت لەسەر نووستنەكەشت وەردەگریت

٣- زیكری خوا بكە كاتێك لەخەو هەلّدەسیت ، لە ( عبادة بن الصامت ) - خوای لیٚ ڕازی بێت - هاتووە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " مَنْ تَعَارَّ مِنْ اللَّيْلِ " ، واتە : هەركەسێك شەو لەخەو هەستاو وتی " لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمُ ، ثُمَّ قَالَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي أَوْ دَعَا أُسْتُجِيبَ لَهُ ، فَإِنْ تَوَضَّأَ وَصَلَّى قُبِلَتْ صَلَاتُهُ "[٣٣] ، ئینجا وتی خوایە گیان لەتاوانەكانم خۆشبە ، یاخود نزای كرد ئەوا نزاكەی وەرگیراوە ، وە ئەگەر دەست نوێژی گرت و نوێژی كرد ئەوا نوێژەكەی

---

[٣٣] - البخاري

وەرگیراوە هەروەها لە( ابو هريرة ) – خوا لێی ڕازی بێت – كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " إذا استيقظ أحدكم فليقل الحمد الله الذي عافاني في جسدي ، ورد علي روحي ، وأذن لي بذكره "[٣٤] ، واتە : هەر كەسێكتان لەخەو هەستا بابڵێت :" الحمد الله الذي عافاني في جسدي ، ورد علي روحي ، وأذن لي بذكره "

٤- كاتێك لەخەو هەڵدەسیت سیواك بكە ، چونكە لە پێغەمبەری خوا ﷺ جێگیر بووە كە دەم و ددانی بەسیواك پاك دەكردەوە كاتێك هەڵدەسا لەشەو

٥- قورئان خوێندنی ناو نوێژەكەت بادەنگت زۆر بەرز نەبێت وە زۆریش نزم نەبێت ، واتە مام ناوەند بێت ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای ( ابو بكر ) – خوا لێی ڕازی بێت – تێ پەڕی كە شەونوێژی دەكرد ، دەنگی نزم بوو و پێی فەرموو : هەندێك دەنگت بەرزبكەرەوە ، وە بەلای ئیمامی عمریش – خوا لێی ڕازی بێت – تێپەڕی دەنگی بەرز بوو پێی فەرموو: هەندێك دەنگت نزم بكەرەوە

٦- دواتر ئەوە لەبیروهۆشی خۆتدا ئامادە بكەی كە خوای گەورە دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا – دابەزینێك كە شایستەی گەورەیی پەروەردگارە – پاشان خوای گەورە دەفەرموێت ئایا

[٣٤] – رواه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي والألباني في الكلم الطيب (٣٨)

كەسێك هەیە داوای لێ خۆش بوون بكات تاوەكو لێی خۆش بم ؟ ئایا كەسێك هەیە بگەڕێتەوە و تەوبە بكات تەوبەی قەبوڵ بكەم ؟ ئایا كەسێك هەیە داوایەكی هەبێت وولآمی بدەمەوە ؟ ئایا كەسێك هەیە داوای ئەمە بكات و داوای ئەوە بكات ؟! بەتایبەتی لە سێ یەكی كۆتایی شەو

٧- بیركردنەوە و تێڕامان لەهەموو ئەو ئایەت و زیكرانەی كە دەیخوێنیت ، چونكە نوێژ ئەوەندەی قبوڵە كە ئاگات لێی لێ بووە و تێی گەیشتووی

٨- دەست كردنی نوێژەكەت بەدوو ڕكاتی سووك هەر وەكو چۆن لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ فَلْيَفْتَتِحْ صَلاَتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ "[٣٥] ، واتە ئەگەر كەسێكتان هەستا بۆ شەونوێژ بابەدوو ڕكاتی سووك دەست پێ بكات ، لەوانەشە ئەو دوو ڕكات نوێژە بۆ ئەوە بێت سێ گرێ سحراوییەكەی شەیتان بكرێتەوە و بەندە گرجوگۆڵ بكاتەوە بۆ نوێژەكانی تر

---

[٣٥] رواه مسلم

## کرداره ئاسانکارییەکان بۆ شەونوێژ

بزانە برای موسوڵمان خوا سەرکەوتووت بکات کە شەونوێژ لەقورسترین پەرستشەکانە لەسەر نەفس ، وە توندووتیژترینیانە لەسەر دڵەکان ، وەقورسترینیانە لەسەر جەستەکان ئیللا لەسەر کەسێك کە خوای گەورە بۆی ئاسان کردبێت ، وە لێرەدا چەند شتێك هەن کە ئەگەر بەندەی موسوڵمان دەستی پێوە بگرێت و ئەنجامی بدات ئەوا خوای گەورە شەو نوێژی بۆ ئاسان دەکات – إن شاء الله تعالى –

وە ئەم شتانەش دەبنە دوو بەشەوە :–

أ- امور ظاهرة : چەند شتێکی ڕووکەش و دەرکەوتوو

ب- واخرى باطنة هەندێکی تریش ناوەکی و شاراوەیە

**یەکەم : کارە ڕووکەش و دەرکەوتووەکان :**

١– ئەوەیە کە بەندەی موسوڵمان نابێت زۆر بخوات و بخواتەوە ، دواتر خەو دای دەگرێت یان شەونوێژی لەسەر قورس دەبێت ، ووترا :خواردنی زۆر مەخۆ کە دەبێتە هۆی خواردنەوەی زۆر ، ئینجا خەوتنی زۆر و دواتر زەرەرێکی زۆر دەکەین ، وە لە (عبدالله بن محمد بن عبيد ) بەسەنەدەوە لە ( وهيب بن الورد )ـەوە

كە فەرموویەتی پێمان گەیشتووە كە ( إبلیس )ی پیس ڕۆژێكیان خۆی لە ( یحیى كوڕی زكریا )دا

پێی ووت بەڕاستی من ئەمەوێت ئامۆژگاریت بكەم ،

ئەویش ووتی درۆ دەكەیت ، تۆ ئامۆژگاریم ناكەیت بەڵام دەربارەی ئەوەی ئادەم باسم بۆ بكە ؟

ووتی ئەوان لای ئێمە سێ چینن

چینی یەكەم ئەمانە توندترین چینیانە لەسەرمان ، ئەمانە كەڕوویان تێ دەكەین و هانیان دەدەین بۆ تاوان كردن و تاوانیان پێ ئەنجام دەدەین ، ئینجا خۆی یەكلای دەكاتەوە بۆ داوای لێخۆشبوون و تەوبەكردن ، ئیتر هەرچی یەكەمان لێی بەدەست هێنابێت پوچەڵی دەكاتەوە ، ئینجا دەیگەڕێنینەوە – بۆ تاوان كردن – ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ تەوبەكردن و داوای لێخۆشبوون ، جا ئەمانە نە وامان لێ دەكەن بەیەكجاری وازیان لێ بهێنین ، وە ناتوانین ئەوەی كە دەمانەوێت بەدەستی بهێنین ، بۆیە لەناڕەحەتییەكی زۆردایین لەگەڵیاندا

جۆری دووەم : ئەوانەن كە بەدەستمانەوە وەكو تۆپ وان بەدەستی منداڵەكانیانەوە بەهەرجۆرێك بمانەوێت دەیانگرین و خۆیان داوە بەدەستمانەوە

جۆری سێیەم : ئەوانەن كە وەكو تۆن پارێزراون ( معصوم )ن ناتوانین هیچیان لێ بەدەست بهێنین

یحیی فەرمووی : بەم پێیە توانیوتە هیچ شتێكت لەمنەوە دەست كەوتووێت ؟

وتی : نەخێر ، یەكجار نەبێت خواردنیان بۆهێنایت منیش خواردنەكەم لات خۆش كرد هەتاوەكو زیاد لە پێویستت خوارد و ئەو شەوە خەوتیت و هەڵنەسایت بۆ شەونوێژ وەكو شەوانی تر ،

یحیی وتی : هەرگیز تێر ناخۆم ،

( إبليس )ش وتی ئەوا منیش هەرگیز ئامۆژگاری نەوەی ئادەم ناكەم

وە لە ( ابن عباس )ـەوە – خوا لێی ڕازی بێت – كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " إِنَّ أَهْلَ الشِّبَعِ فِي الدُّنْيَا هُمْ أَهْلُ الْجُوعِ فِي الآخِرَةِ غَدًا "[٣٦] ، واتە بەڕاستی ئەوانەی بەردەوام لەم دونیادا تێرن ئەوانەن كە سبەینێ لەقیامەتدا برسین

---

[٣٦] – رواه الطبراني باسناد حسن قاله المنذري في الترغيب ( ٤ / ١٢٩ ) وقال الألباني في صحيح الترغيب والترهيب ( حسن لغيره ) برقم (٢ / ٢٤٥).

وە لە ( عمر بن الخطاب )ـەوە – خوا لێی ڕازی بێت دەفەرمووێت ووریای تێری بن ، بەڕاستی قورسە لەم دونیادا و بۆگەنی لەدوای مردن

وە ( لقمان ) بەكوڕەكەی دەفەرمووێت : ڕۆڵەكەم ئەگەر گەدە پڕبوو ئەوا بیروهۆش دەخەوێت ، وە ئەندامەكان دادەنیشن لە عیبادەت كردن

وە ( أبو سليمان الداراني ) دەفەرمووێت هەر كەسێك تێر بخوات شەش ئافات ڕووی تێ دەكات شیرینی موناجاتی خوای گەورە لەدەست دەدات ، وە تواناى لەبەركردنی دانایی نامێنێت ، وە لە بەزەیی هاتنەوەی خەڵك بێبەش دەبێت ، چونكە ئەگەر تێربوو وادەزانێت هەموو خەڵكی تێرن ، وە عیبادەت قورس دەبێت ، وە شەهوەتەكان زیاد دەكات ، وە هەموو خەڵكی بەدەووری مزگەوت دەسوڕێنەوە بەڵام تێرەكان بەدەووری زبڵدانەكان دەسوڕێنەوە

وە ( محمد بن واسع ) دەفەرمووێت هەر كەسێك خواردنی كەم بوو دەتوانێت تێ بگات و خەڵكیش تێبگەیەنێت ، وە بێگەرد و دڵ ناسك دەبێت ، وە بەڕاستی زۆر خواردن خاوەنەكەی قورس دەكات لە زۆرێك لەو كارانەی كە ئەیەوێت ئەنجامی بدات

وە ( عمرو بن قيس ) دەفەرمووێت وورياى زۆر خواردن بن چونكە دڵ ڕەق دەكات

وە ( الحسن البصري ) دەفەرمووێت : بەڵاكەی ئادەمی باوكتان خواردنەكەی بوو ، وە بەڵای ئێوەش هەر ئەوەیە هەتاوەكو ڕۆژی قیامەت

وە ووتراوە : ئەگەر دەتەوێت جەستەت تەندروست بێت و خەوت كەم بێت ، ئەوا خواردنت كەم بكەرەوە

وە ( إبراهيم بن ادهم ) دەفەرمووێت هەر كەسێك سكی گرت ئەوا ئاینەكەی گرتووە ، وە هەر كەسێكیش برسێتی خۆی گرت ئەوا هەموو ڕەوشتە چاكەكانی گرتووە ، وە بەڕاستی سەرپێچی كردن خوا لەمرۆڤی برسیەوە دوورە ، وە لە تێریەوە نزیكە ، وە تیربوونیش دڵ دەمرێنێت

وە ( الشافعي ) دەفەرمووێت : تێربوون جەستە قورس دەكات ، وە زیرەكی و تێگەشتن لادەبات ، وە خەو دەهێنێت و خاوەنەكەی خاو دەكاتەوە لەعیبادەت كردن

پوختەی باس ئەوەیە كە خواردن كەم بكەیتەوە بەوەی كە پێش تێربوون واز لەخواردن بهێنێت ، وە نیشانەی ئەمەش ئەوەیە كەوازت هێناوە حەزم بكەیت نان بخویت

٢- ئینجا بەڕۆژ زۆر خۆی ماندوو نەكات بەو كارانەی كە ئەندامەكانی لەشی سست دەكات و دەمارەكانی لاواز دەكات چونكە ئەمە دەبێتە هۆی خەو لێ كەوتن

٣- واز لە ( القیلولة ) نەهێنێت ، واتە ساتێك خەو لەچێشتەنگان ، بۆ ئەوەی یارمەتی دەرێك بۆ هەڵسان بۆ شەو نوێژ ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " قیلوا ، فإنّ الشیاطین لا تقیل "[٣٧] ، واتە ( القیلولة ) بكەن چونكە شەیتان ( القیلولة ) ناكات

هەروەها لە ( سنن ابن ماجە بسند ضعیف )دا هاتووە (بەخواردنی پارشێو یارمەتی خۆتان بدەن بۆ ڕۆژووگرتن ، وە بە ( القیلولة ) كردنیش یارمەتی خۆتان بدەن بۆ شەو نوێژ كردن

وە ( الحسن البصري ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – بەلای ئەوانەی كە لەبازاڕدا ئیش دەكەن و دەیفەرموو گومانی ئەوە دەبەم كە شەوی ئەمانە شەوێكی خراپ بێت چونكە ( القیلولة ) ناكەن

٤- واز لەسەرپێچیەكان بهێنیت چونكە ئەمە دڵ ڕەق دەكات و دەبێتە بەربەست لەنێوان دڵ و هۆكارەكانی ڕەحمەت ، چونكە ئەوەی تاوان بكات ناتوانێت سەركەوتوو بێت بۆ ئەنجامدانی شەو

---

[٣٧] - السلسلة الصحيحة ( ١٤٤٧ )

نوێـژ ، وە هـەر کەسـێك لـە ڕۆژیـدا چـاکەکار بێـت ئـەوا لەشـەویدا سەرکەوتوو دەبێت

وە پیاوێك بە( الحسن البصري ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – ووت ئەی باوکی سعید بەڕاستی من نەخۆش نیم بەشەو ، حەز دەکەم شەو نوێـژ بکـەم و دەست نوێژەکـەم ئامـادە دەکـەم ، بۆچـی هەڵناسـم بـۆ شـەو نوێـژ ؟!( الحـسن البـصري ) پێـی فـەرموو تاوانەکانت کۆتی کردووی

وە بە ( عبدالله بن مسعود ) – خوا لێی ڕازی بێت – ووترا ئـەوە بۆچـی نـاتوانین شـەو نوێـژ بکـەین ؟ فـەرمووی تاوانـەکانتان دووری خستونەتەوە

٥- واز لە خۆش گوزەرانی زۆر بهێنیت لەجێگـەی نووسـتن ، چونکە ئەمە بەربەستە لەبەر هەستان لەخەو بۆ شەو نوێژ ، ئەوەتا پرسـیار لـە ( حفـصة )ی دایکـی ئیمانـداران دەکرێـت دەربـارەی جێگەکـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ؟ ئـەویش ووتـی : لەخوریـەکی زبـر بـوو دووقاتمـان دەکـرد و لەسـەری دەخـەوت ، شـەوێك لەشـەوەکان وویستم چوار قاتی بکەم بۆ ئـەوەی جێگەکـەی نـەرمتر بێـت ، بۆیـە کردمـان بەچـوار قـات ، کاتێـك ڕۆژ بوویـەوە فـەرمووی ئـەوە چ جێگەیەکتان بۆ ڕاخستووم ئەم شـەو ؟ ووتمـان : جێگەکـەی خۆتـە

بەلاَم چوار قاتمان كرد بۆ ئەوەی نەرمتر بێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی بگەڕێننەوە وەكو پێشتر وای لێكردم ئەم شەو هەڵنەستم بۆ شەو نوێژ [٣٨]

هەروەها لە ( عائیشة )ەوە – خوا لێی ڕازی بێت – فەرمووی " إِنَّمَا كَانَ فِرَاشُ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- الَّذِى يَنَامُ عَلَيْهِ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهُ لِيفٌ "[٣٩] ، واتە : بەڕاستی ئەو جێگەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری دەخەوت لەپێستەیەكی خۆشەكراو بوو وە ناوەكەشی لەلیفی دار خورما بوو

٦- وازهێنان لە لەقسەكردنی زیاد و بینینی زیاد ، چونكە ئەمانە دڵ ڕەق دەكەن و دووری دەخاتەوە لە پەروەردگار

٧- زۆر زیكركردنی خوای گەورە ، چونكە زیكر ژیانی دڵەكانە ، وە خاوەنی دڵی زیندوو سەركەوتوو دەبێت بۆ شەو نوێژ – إن شاء الله – چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو كەسەی زیكر دەكات بەزیندووی شوبهاندووە ، كە بەڕاستی دڵی زیندووە ، وە ئەو كەسەی كە بێئاگایە لەزیكری خوای شوبهاندووە بەمردوو ، كە بەڕاستی دڵی مردووە ، لە ( ابي موسى الأشعري ) – خوای لێ ڕازی بێت – فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " مَثَلُ الَّذِي

---

[٣٨] – رواه الترمذي في الشمائل ( ١٥٦ ) ضعفه الألباني في الضعيفة برقم ( ٤٢٢٣ )

[٣٩] – رواه مسلم في اللباس برقم ( ٢٠٨٢ )

يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لَا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَـلُ الْحَـيِّ وَالْمَيِّـتِ "[٤٠] ، واتـه نموونـەی ئـەو كەسـەی كـە زيكـری خـوا دەكـات و ئـەوەش كـە زيكـری ناكـات نموونەی زيندوو و مردوو وايە

٨- خواردنی حەڵاڵ و دووركەوتنەوە لەحەرام ، وە هەتاوەكو بەندە بەدوای حەڵاڵدا بگەڕێت سەركەوتووتر دەبێت ، ( سهل بن عبدالله التستري ) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەفەرمووێت هەر كەسێك حەڵاڵ خۆر بێت فەرمانەكانی خوا جێبەجێ دەكات بیەوێت یان نەیەوێت ، وە لە ( ابو هريرة ) – خوای لێ ڕازی بێت – كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی " إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ لاَ يَقْبَلُ إِلاَّ طَيِّبًا وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ فَقَالَ ﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾"[٤١]

واتـه : بەڕاسـتی خـوای گـەورە پاكـە و پـاكیش نـەبێت وەری ناگرێـت ، وە بەڕاسـتی خـوای گـەورە فـەرمانی بەئیمانـداران كـردووە بەوەی كە فەرمانی بەپێغەمبەران كردووە كە فەرموویـەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾

[٤٠] – رواه البخاري ومسلم
[٤١] – سورة المؤمنون (٥١) .

واتە ئەی پێغەمبەران لەوەی كە پاك و چاكە بخۆن و ئیشی چاكە بكەن بەڕاستی من بەكردارەكانتان بەئاگام ، هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ ﴾[٤٢] ، واتە ئەی ئەو كەسانەی ئیمانتان هێناوە لە پاكترین ئەوەی رزقمان داون بخۆن ، ئینجا باسی پیاوێكی كرد سەفەر درێژدەكاتەوە قژوپرچی ژاكاو و خۆڵاییە دەست بەرز دەكاتەوە بۆ ئاسمان پەروەردگارا پەروەردگارا ، خواردنەوەی حەڕامە و خواردنەوەكەی حەڕامە و بەحەڕام گۆش كراوە ، چۆن وولامی دوعاكەی دەدرێتەوە[٤٣] ، هەروەها لە ( ابي سعيد الخدري ) – خوا لێی ڕازی بێت – فەرموویەتی :كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی " من أكل طيباً وعمل في سنة وأمن الناس بوائقه دخل الجنة "[٤٤] ، هەر كەسێك پاك خۆر و حەڵاڵ خۆر بێت ، وە بەسوننەتەوە ئیش بكات ، وە خەڵكیش لەئازارەكانی پارێزراو بوون ، دەچێتە بەهەشتەوە

---

[٤٢] – سورة البقرة (١٧٢) .

[٤٣] – رواه مسلم

[٤٤] – رواه الترمذي ( ٤ / ٧٨ ) وقال حسن صحيح ، ضعفه الألباني في ضعيف الترغيب والترهيب بـرقم (١٠٦٨ ) وضعيف سنن الترمذي ( ٤٥٣ )

**دووەم : كرداره ناوەكیە نادیارەكان ( شاراوەكان ) :**

١- سەلامەتی دڵ لەڕق و كینە لە موسوڵمانان هەروەها لە بیدعە كردن ، وە دووركەوتنەوە زیادە غەمەكانی دونیا بۆ ئەوەی دڵ سەرقاڵ بێت بەخواكەی كە خاوەنیەتی و وازهێنان جگە لەویش

٢- ترسێك كە بەبەردەوامی لەدڵدا بێت چونكە ئەگەر بەندەیەك بیری كردەوە لە ناڕەحەتییەكانی ڕۆژی دوای و پلە نزمەكانی دۆزەخ ( دركات جهنم ) خەوی دەفڕێت و ووریای زیادە دەبێت و ترسەكەی زۆر دەبێت وەكو ووتراوە

منع القرآن بوعده ووعيده

مقل العيون بليلها أن تهجعا

فهموا عن الملك الجليل كلامه

فرقا بهم ذلت إليه تخضعا

وە ووتراوە

إذا ما الليل أظلم كابدوه

فيسفر عنهم وهم ركوع

أطار الخوف نومهم فقالوا

وأهل الأمن فى الدنيا هجوع

٣- بیربكاتەوە لە پاداشت و چاكەی شەو نوێژ بەگوێ گرتن لەو ئایەت و فەرموودە و ووتەی پێشینان كە لەم بارەیەوە هاتووە ، چونكە ئەمە هانی دەدات بۆ ئیشی چاكە و ناڕەحەتیەكانی لەسەر سووك دەكات ، چونكە بەڕاستی تامەزرۆی بەهەشت هانی موسوڵمان دەدات بۆ كاری چاكە و تێكۆشان بۆ بەدەست هێنانی ئەوەی كە داواكراوە لەپەروەردگاری خەڵك

٤- بیربكەرەوە لە شیرینی موناجات و وەستان لەبەر دەستی پەروەردگار ، چونكە شەو نوێژ چێژێك لەدڵدا دروست دەكات و شیرینیەك لەنەفسدا دروست دەكات و كەس هەست بەم چێژ و شیرینیە ناكات مەگەر كەسێك نەبێت كە خۆشەویستی تەواوی خوای لەدڵدا جێگیر بووبێت ، وە شوێن كەوتنی تەواوی پێغەمبەری خوا ﷺ ، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾[45] ، واتە پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خواتان خۆش ئەوێت ئەوا شوێنی من بكەون خوا خۆشتانی دەوێت و لەتاوانەكانتان خۆش دەبێت

٥- هیوا و ئاواتی كورت لەم دونیا چونكە هاندەرێكە بۆ ئیش كردن ، ووریای هیوا و ئاواتی درێژبە چونكە هاندەرێكە بۆ

[45] - سورة آل عمران (٣١)

تەمـەڵی و بیـزاری دێنێـت بـەدوای خۆیـدا ، وە بێبەشـت دەكـات لەپۆشاكی جوانی بەهەشتدا و سێبەری ، لـە ( عبـدالله بـن عمـر ) – خوای لێ ڕازی بێت – فەرمووی : پێغەمبەری خوا ﷺ شانی گرتم و پێی فەرمووم : " كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ " ( وَكَانَ ابْـنُ عُمَرَ يَقُولُ ) " إِذَا أَمْسَيْتَ فَلَا تَنْتَظِرْ الصَّبَاحَ وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلَا تَنْتَظِرْ الْمَـسَاءَ وَخُذْ مِنْ صِحَّتِكَ لِمَرَضِكَ وَمِنْ حَيَاتِكَ لِمَوْتِكَ "( رواه البخاري)

واتـە لـەم دونیادا وەكو غـەریبێك یـان ڕێبوارێك بژی ، وە (ابن عمر ) دەیفـەرموو ئەگـەر ئێـوارەت بەسـەردا هـات چاوەڕوانی بەیانی مەكە ، وە ئەگـەر بـەیانیت بەسـەردا هـات چاوەڕوانی ئێـوارە مەكە ، وە كردەوەكانت زیاتر بكە لەكاتی لەش ساغی بۆ ئەوەی كەم و كورتییەكانی كـاتی نەخۆشـی پڕبكاتـەوە ، وە لەژیانتـدا كـردەوەی زیاتر بكە بۆ خۆش بەختی لەكاتی مردندا

٦– بیربكـەرەوە لەخـەوتنی نـاو گـۆڕی تاریـك ، چـونكە ئەمـە هەستانی تاریكی شەوت لەسەر ئاسان دەكات

ئیمامی بوخاری – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەفەرمووێت

اغتنم في الفراغ فضل ركوع فعسى أن يكون موتك بغته

كم من صحيح مات من غير سقم ذهبت نفسه الصحيحة فلتة

سوپاس بۆ خوای بەبەزەیی تەواو بووم لە وەرگێرانی ئەم نامیلكەیە

شەوی شەممە ١/ ٢ – ذي الحجة ١٤٣٢هـ

٢٨ / ٢٩ – ١٠ – ٢٠١١ ك

# ناوەڕۆك